# دیوانا

# مەلا بۆتانی

## مەلا عەلی مەلا یەحیا مەلا عەلی بۆتانی

۱۹۰۹- ۱۹۹۰

ڤەوژارتن و بەرهەڤکرن

د. فاخر حەسەن گولی


Zakho Centre
for Kurdish Studies
سەنتەرێ زاخو بو ڤەکولینێن کوردی

سەنتەرێ زاخۆ بۆ ڤەكۆلینێن كوردی


| | |
|---|---|
| پەرتووك | دیوانا مەلا بۆتانی |
| ڤەوژارتن و بەرهەڤكرن | د. فاخر حەسەن گولی |
| چاپ | ئێكێ/ ٢٠٢٢ |
| دیزاین | دیار عبدالله |
| بەرگ | جەگەرخوین جەمیل |
| | وارهێل عبدالباقی |
| ISBN | 978-9922-661-05-6 |
| ژمارا سپاردنێ | D- / ٢٦٤٧ / ٢١ |





Zakho Centre for Kurdish Studies
سەنتەرێ زاخۆ بۆ ڤەكۆلینێن كوردی

zcks@uoz.edu.krd +964 750 471 0863
Iraq- Kurdistan region, Zakho- Univesity of zakho

## پێشەکی

ئەڤ دیوانە ژ ئەوان جۆرە دیوانایە ئەوێن چەندین هەلبەستێن وەلاتپاریزی ـ سیاسی و جڤاکی بخوەڤە دگریت، سەرەڕای ئەوێ چەندێ کو (مەلا عەلی) وەك گەلەك زانایێن دیترێن کوردان شاهرەزایەکا باش د بیاڤێن شەریعەت، تەفسیر و... هتد هەبوو. لێ پێنگاڤەکا دیتر هاڤێت ئەو ژی ڤەهاندنا هەلبەستان ب هەر سێ زمانێن کوردی، عەرەبی و فارسی. د ئەڤێ پێشەکیێدا هەوڵ هاتیە دان زێدەباری ژیاننامەیا جڤاکی، ئایینی و سیاسیا هەلبەستڤانی، ئاماژە ب گرنگترین تیبینیێن ئەڤێ دیوانێ بهێتەکرن.

### هەلبەستڤان ژلایێ جڤاکیڤە:

(مەلا عەلی مەلا یەحیا مەلا عەلی بۆتانی)، ل سالا (١٩٠٩)ێ ل گوندێ (پونگینە) ئەوا کو بابێ ئەوی (مەلا یەحیایی) بۆ جارا ئێکێ وەك گوند ئاڤاکری، سەر ب دەڤەرا (بەردەڕەش) چاڤێن خوە ل ئەڤێ جیهانێ ڤەکرن. ل دەستپێکا هەلبەستا (خوێندنی فەقیان) دبێژیت:

بـــاوکم "یـــەحیـــا یـــە" دایکـــم"ڕەحیمـــە"
لـــە دێـــی پونگینـــە لـــە دایـــك بوویمـــە

بـــاوکم مـــەلا بـــوو بـــێ موچـــە و بـــەرات
ژیانمـــان بـــەســـەربـــرد بـــە "فتـــرە و زەکـــات"

هەر د ئەوێ سالێدا دەیکا ئەوی مالئاڤایی کر و ب مەبەستا سەخبێریکرنێ بابێ ئەوی ئەو ڕادەستی مەتا ئەوی ل گوندێ ماجیدئاوا (سەر ب ناڤچەداریا گویر ـ دەڤەرداریا مەخموور) کر هەتا مەزن بووی. مەلا عەلی ژیانا هەڤژینیێ ل گەل خانم (حەلیمە عەلی حەسەن) کو خەلکا گوندێ

(بیرسیاڤ) دەڤەرا (شێروانا مەزن) بوو پێکهینا و خودایێ مەزن پێنچ کورێ ب ناڤێ (عەبدولغەنی [٢٠١٩ مالئاڤایی کرا، ئیبراهیم، عەبدولفەتاح، تەحسین و عامر [١٩٨٢ د رویبارێ دیجلەیدا خەندقی] و کچەك ب ناڤێ ئەدیبە [د ژیێ ئێك هەیڤییێدا وەغەر کر] ب ئەوان بەخشی. مەلا عەلی ل رێککەڤتی (١٩٩٠/١٠/١٧) بۆ هەتاهەتایی ژ ئەڤێ جیهانێ بارکر.

**بنیاتا مالباتا هەلبەستڤانی:**

بنیاتا مالباتا (مەلا عەلی) ژ گوندێ (شاخ)ە ل چیایێ جوودی ئەوا دکەڤیتە دەڤەرا بۆتان ل باکوورێ کوردستانێ، پاشان ژ گوندێ ناڤبری بەرەڤ بازێرێ (جزیرێ) پایتەختا میرگەها بۆتان چوون و ئاکنجیبوون، لێ پشتی کەڤتنا میرگەهێ و بێ ئەنجامیا هەولێ و بزاڤێن کورێن (بەدرخان بەگی) ل سالا (١٨٧٨)ێ، لەشکەرێ عوسمانی هیرشێن توند برنە ل سەر دەڤەرا (جزیرێ) ب ئەڤێ چەندێ ژ نەچارێ خەلکێ مال و ملکێن خوە هێلان و هەر ئێك بۆ دەڤەرەکێ چوون، باپیرێ (مەلا عەلی) ل گەل برایێ خوە (میرزا)ی ب رێکا کەلەکان دەربازی رویبارێ دیجلەی بوون و خوە گەهاندەنە مویسل و ل دەڤەرێن جوداجودا یێن کوردستانێ مینا گوندێ هوستان، بارزان و... چەندین دەڤەرێن دیتر بنەجە و ژیان.

**قوناغێن فەقێیاتی و مەلاتیا هەلبەستڤانی:**

مەلا عەلی خواندنا خوە یا دەستپێکێ ل دەڤ بابێ خوە خواند، پاشان ژبۆ بدەستڤەهینانا زانین و زانستێ بەرەڤ مویسل و شەقلاوە و وەلاتێ ئیرانێ و گەلەك جهێن دیتر چوو و مفا ژ مەزنە زانایان وەرگرت.

پشتی ناڤبری شیای ل چەندین دەڤەران ل نك مەزنە زانایان زانستێ بدەستخوەڤە بینیت و ببیتە (مەلایێ دوازدە علم)، دوو جاران ئیجازا مەلاتیێ

وەرگرت، جارا ئێکێ ل دەڤ زانایێ مەزن (ئەبوبەکر ناڤدار ب مەلا ئەفندی کچك مەلا) ئەوێ ل سالا (١٩٤٢)ێ مالئاڤاییی کری. جارا دوویێ ل نك زانایێ مەزنێ مویسل (موحەمەد کوڕێ حاج عوسمان ئەفندی ڕضوانی) وەرگرتبوو. پشتی ئەڤێ مەلا عەلی ژی ئیجازا مەلاتیێ ب چەندین زانایان بەخشیبوو.

هەلبەستڤان د سالێن چلاندا ژ سەدەیا چەرخێ بیستێ ب کارێ پێشنڤێژی و گۆتارخوینیا گوندێ (گردەپان) ڕادبوو، لێ ل سالا (١٩٥٤)ێ دەست ژ پیشەیا ناڤبری بەردا بەرەڤ باژێڕێ مویسلڤە چوو و ل وێری ئاکنجیبوو. پشتی بنەجهبوونا ئەوی ل باژێڕێ ناڤبری دەست ب پیشەیا پەڕۆك فرۆشیێ (بەزازی) کر و هەتا مالئاڤاییێ ل سالا (١٩٩٠)ێ یێ بەردەوام بوو. کوڕێ ئەوی (پ. د. عەبدولفەتاح) ل سەر دەست ژ بەردانا ئەوی ژ پیشەیا مەلاتیێ کو نە کارەکێ ب زەحمەت بوو پرسی، د بەرسڤدا گۆت: "د ڕاستیدا کارێ مەلاتیێ نە پیشەیە، دەمێ ئەز مەلایێ گوندی من هەست ب ئەوێ چەندێ دکر کو ئەز ژبۆ گوندیان بارگرانی بووم، کو تەڤایا ئەوان کار دکرن و ب ناڤێ زەکاتێ و فترەیا مینا ئەڤان هاریکاریا من دکرن. هەر ژبەر ئەڤێ چەندێ من دەست ژ کارێ مەلاتیێ بەردا و ئێدی نەشیام ل سەر سەدەقەیان بژیم، ئەو زانایێ ئایینێ کو ب کرێ یان ب مووچەی کار دکەت، نەچار دبیت د ڕەفتار و کار و کریارێن خوەدا ملکەچێ ئەوان بنەمایان بیت کو ل گەل ئایینێ ئیسلامێ نە گونجیت. درێژە پێدا و گۆت: هەتا ئەوی سەردەمێ کو ب پیشەیا زانایێ ئایینی مژویل بوو، حەژێکەرێ کارێن بیستانکاری و کارێ چاندێ بوو. هەر ژبەر ئەڤێ چەندێ من مالباتا خوە ژبۆ مویسل ڤەگۆهاست و ب زەند و دەستێن خوە مەزاختێن خوە دەربینم و ژیارا خوە بکەم". د مالکە هەلبەستەکێدا دبێژیت:

يـــابني قـــومي جميعـــا اســـمعوا صـــوت يراعـــي
ان اشـــــهى مالـــــدي ان اعـــــيش بـــــذراعي

ژلايەكێ ديتر (مەلا عەلى) ڕۆژنامەيێن ئەوى سەردەمى ب ڕێكا بابێ خوە بدەستخوەڤە دهينان و دخواندن. كو بابێ ئەوى ب ڕێيا (مەعرووف ئاغا پيرداوود دزەيى) ئەندامێ جڤاتا نوينەرێ عيراقێ يێ ئەوى سەردەمى ب دەست د ئێخستن. ژ ئەوان چاپەمەنيان:(حبزبوز و البلاد) كو ناڤبرى ب شێوەيێ نەپەنى دوير ژ چاڤێن دوست و هەڤال و زەلامێن ئايينى ل مال دخواندن داكو ب ئەڤێ چەندێ نەبيتە پێتڕانك و ڕەخنەگرتنێ هەيە. كو كارێن خويندكاران ب تنێ خواندنا پەرتووكێن دەستنيشانكرينە كو پێكهاتينە ژ (نەحو و سەڕف و مەنتق و بەلاغە و زانستێ كەلام)ە. بكورتى كەسەك بوو دەمارگيريا ئايينى نەبوو و د ئەوێ باوەريێ دابوو كو هەمى جۆرە پەرتووكان بخوينن.

## هەلبەستڤان و ڤەهاندنا هەلبەستان:

يا ديار ل دويف ئەوان بەلگەنامەيێن ل بەردەست هەلبەستڤانى د داوييا سالێن چلان ژ سەدەيا بووريدا دەست ب ڤەهاندنا هەلبەستان كربوو، لێ ژبەر هەست و هەلويستێ (مەلا عەلى) يێ نەتەوى و وەلاتپاريزيێ و پەيوەندييێن ئەوى يێن بەردەوام ل گەل شۆڕەشا ئەيلوولى (١٩٦١-١٩٧٥)ێ هەر ئەڤ چەند بو هوكارێ كو ژبۆ جارا ئێكێ ل سالا (١٩٦٣)ێ پشتى كودەتايا ٨ شوباتێ هيزا ناڤدار يا ئەوى سەردەمى كو دگۆتنێ (حرس قومي) و جارا دوويێ ل سالا (١٩٦٥)ێ پوليسان سەر مالا ناڤبريدا گرتن و پشكنينكرن و هەر بەلگە و كاغەزێن ب دەست ئەوان كەڤتين ل گەل خوە برن. لەوڕا پڕانيا هەلبەسێن ناڤهاتى يێن دەستپێكێ هەتا سالا (١٩٦٥)ێ ژناڤچوون، پشتى ئەڤێ مێژوويێ هەلبەستڤانى هەولا بيرهينانا هەلبەستێن بوورى كرن ڕەنگە هندەك ژ ئەوان

ب کێموکاسی زڤڕاندبن، لەوڕا ب تنێ هەلبەستێن سالێن حەڤتیان وێڤە ل بەردەستن. هەردیسان ل ڤێرێ فەرە ئاماژە ب خالەکا گەرنگ بهێتەکرن کو (مەلا یەحیا) بابێ (مەلا عەلی) کەسەکێ هەلبەستڤان بوو و ب هەر سێ زمانێن کوردی، عەرەبی و فارسی هەلبەست ڤەهاندینە، واتە سەرەرای کو مەلا عەلی د بیاڤێ هەلبەست نڤیسینێدا کەسەکێ خودان شیانبوو لێ نەڤیا کارتێکرنا بابێ بهێتە ژبیرکرن کو بۆ ئەوی وەك ڕێنشاندەرەك بوو. ژلایەکی دیترڤە هەلبەستڤان گەلەك داخباری هەلبەستێن (مەلا ئەحمەدێ جزیری، ئەحمەدێ خانی، حاجی قادرێ کویی و هەر دوو هەلبەسڤانێن فارس (سەعدیێ شیرازی و عومەرێ خەیام) بوو کو ب خواندنا هەلبەستێن ئەوان هەست ب وەستیانێ نەدکر.



### هەلبەستڤان ژلایێ وەلاتپارێزیڤە:

مەلا عەلی کەسەکێ وەلاتپارێز و نەتەوەیی بوو، ل دەمێ شێخێن بارزان د ناڤبەرا سالێن (١٩٣٤-١٩٣٦)ێ بۆ مویسل هاتینە دویرکرن، مەلا یەحیا (١٨٨٠- ١٩٥٩)ێ ل گەل کوڕێ خوە مەلا عەلی کو ئەوی سەردەمی خویندکارێ خواندنا ئایینی بوو بەردەوام هاتن و چوونا مالا شێخ ئەحمەد بارزانی و برایێن ئەوی دکرن، مەلا عەلی بەردەوام ل دویڤ نووچە و پێشڤەچوونێن کێشەیا کوردان دچوو، چەندین جاران ل مویسل و شەقلاوە مەلا مستەفا بارزانی (١٩٠٣- ١٩٧٩) دیتبوو. کەسوکارێن خوە ژ خەبات و تێکوشانا بارزانی و هەڤالێن ئەوی و هەستێ ئەوان یێ نەتەوی ئاگەهدار دکرن. ل سالا (١٩٦٥)ێ ژبەر پەیڤا ئەوی بەرامبەر هژمارەکا کورد و عەرەبان ئەوا تێدا گۆتی کو پێدڤییە کورد ببنە خودان دەولەت هاتە زیندانیکرن لێ ب بژیڤانیا (آل الرضوا) هاتە ئازادکرن. هەر کەسێ ب هویری هەلبەستێن

ئەوی بخوینیت دێ بۆ ئەوی ڕۆهن و ئاشكرا بیت. هەژی گۆتنێیە كو هەستێ ئەوی یێ نەتەوی بۆ دیرۆكا باب و باپیرێن ئەوی د زڤڕیت كو هەر ژ سەردەمێ میرگەها بوتان هەتا دگەهیتە مەلا عەلی بەردەوام خودان هەلویست بوون و كێماسی د پرسێن وەلاتپارێزی و نەتەوەیی دا نەدكرن. ژلایەكی دیترڤە مەلا عەلی نە دگەل ئەوێ چەندێ بوو كو ئایین و سیاست تێكهەلی هەڤ بكەن و پێدڤیە ژ ئێكدوو بهێنە جوداكرن، چونكە ب ئەڤێ كاری زیانێ دگەهینتە ئایینی و پتر نێزیكی بازرگانیێ یە. هەروەسا د ئەوێ باوەریێ دابوو كو بەلاڤبوونا هزروبیرێن پارتێن ئیسلاما سیاسی ل كوردستانێ دێ زیانێ گەهینیتە پرسا كورد و ئاستەنگێ ئێخیتە پێشڤەچوونێ ئەوێ. هەژی گۆتنێیە كو ژبەر وەلاتپارێزیا هەلبەستڤانی بەردوام دژاتیا دەرەبەگان دكر و پشتەڤان جووتیار و كەسانێن زەحمەتكێش بوو.

## گرنگترین تیبینیێن ئەڤێ دیوانێ:

ئەڤ دیوانە مینا گشت دیوانێن دیترێن هەلبەستڤانان خوەدی چەندین تیبینیە، لێ هەوڵ هاتیەدان ئاماژە ب گرنگترینی ئەوان بهێتەكرن و ب ئەڤی شێوەیێ ل خوارێنە:

- ئەڤ دیوانە ژ (٣١) هەلبەستێن سیاسی، وەلاتپارێزی، جڤاكی كو ب هەر سێ زمانێن كوردی، عەرەبی و فارسی پێكهاتیە. لێ پڕانیا ئەوان ب زمانێ كوردی ـ زاراڤێ سۆرانینە.
- ب گورەی ئەڤان هەلبەستێن ل بەردەست، هەلبەستا (گردەپان) وەك ئێكەمین هەلبەستا (مەلا عەلی) كو ل ڕێككەڤتی (١٩٧٤/٤/٢٠)ێ ل بازێڕێ (مویسل) ڤەهاندی دهێتە هژمارتن، ل دەستپێكا هەلبەستێ دبێژیت:

گـــــردەپانـــــە دیـــــێ ئیمـــــە خۆشـــــە و دەرمـــــانی دڵـــــە

زەوییەکانی بەرز و نزمن بەشێکیان زۆرگ و ملە
چەند ساڵ لەمە و پێش ڕووبار و باغ و باغاتی هەبوو
ئیمڕۆ گشت دانیشتوانی لێ دەکەن هیشکە مەلە

- ل دویڤ ئەڤێ دیوانێ پتریا هەلبەستان چ کوردی و چ عەرەبی ل ساڵا (١٩٧٦)ێ ل باژێرێ (مویسل) هاتینە ڤەهاندن، کو پێکهاتینە ژ: " پڕ ژانە ژیانم"، "شەویك لە شەوان"، "قم يا علي"، "طلب العلم"، "ايها الانسان"، "ادرك الناس" و " بمناسبة عيد الاضحى المبارك".

- مەلا عەلی ب تنێ جارەکێ ناڤێ خوە وەك (عەلی) د هەلبەستا (ژیانم) هێنایە و ل دواییا ئەوێ دبێژیت:

بە من نالێ (عەلی) کەی خواى دەناسی
بەرامبەر خوا بە پیری بەندە سستە

- ب هیچ ڕەنگەکی مە دەستکاریا ڕێنڤیسا هۆزانڤانی نەکریە، ب تنێ د ئەوان پەیڤاندا کو ب شاشیا ڕێنڤیسی دهێنە هژمارتن و کارتێکرنێ ل ڕیتم و واتایا هۆزانێ و چارچووڤێ گشتیێ ئەوێ ناکەت، ڕاستڤەکرن هاتینە ئەنجامدان، بۆ نموونە: (چوـ چوو)، (بوـ بوو)، (بوـ بۆ) و... هتد.

- هەلبەستڤان ب نڤیسینا ڕۆژ و هەیڤ و ساڵ و جهێ ڤەهاندنا هەلبەستێ، تایبەتمەندیەکا دیتر دایە دیوانێ. کو هەلبەست ژی ل دویڤ مێژوویێن دیاریکری هاتینە ڕێکخستن.

- هندەك هەلبەستێن ئەڤێ دیوانێ بێ مێژوو و جهێ ڤەهاندنێنە و مە هەوڵدایە جهێ ئەوان ل دویماهیا هەر پشکەکا دیوانێ بکەین، داکو تێکەلی هەلبەستێن دیتر نەبن و ل پەراوێزا هەر ئێك ژ ئەوان، هەڤۆکا (مێژوویا ڤەهاندنا ئەڤێ هەلبەستێ نەهاتیە نڤیسین) بکارهینایە.

- هەر پەیڤەکا نە ڕۆهن یان پەیڤێن پێدڤی ب پێناسەکرنێ د دیوانێدا، ب شێوەیەکێ ڕێکوپێك ل پەراوێزان هاتینە نڤیسین.

- ل دەڤ (مەلا عەلی) خواندن دەرمانێ هەمی تشتەکییە، پێدڤییە گرنگی ب خواندنێ بهێتەدان، چونکە نە خویندەواری وەك ئێشا سەرێتانێیە، ل دەستپێکا هەلبەستا "خوێندن" ب ئەڤی شێوەیێ دبێژیت:

خوێندن بۆ مرۆڤ گەلێك دەرمانە
نە خوێندەواری وەك سەرەطانە

ل داوییا هەلبەستا "کوردستان" دبێژیت:

بچووك بنێرن بۆ قوتابخانە
خوێندن بۆ ئێمە دار و دەرمانە

- کوردستان ب نێرینا هەلبەستڤانی واتایا جوانی، ئاخ، وەلات و... هتد، د هەلبەستا بناڤێ "شەوێك لە شەوان" دیار دکەت کو ژبەر ئەوان هزروبیرێن ئەوی ل سەر نەخوەشیێن کوردستانێ دکرن هەتا سپێدێ خەو ب چاڤێن ئەوی نەکەڤتن. ل دەستپێکا هەلبەستێ وەها دبێژیت:

شەوێك لە شەوان تاكو بەر بەیان
چاوم نەچووە خەو لە داخی کوردان

لە دیاربەکرەوە تا کێوی حەمرین
کەرکووکی خۆمان تاكو خانەقین

د هەلبەستا ب ناڤێ (کوردستان) باسێ دابەشکرنا کوردستان ل سەر چار وەلاتان دکەت و دبێژیت:

کوردستانمان خاکی رەنگینە
پارچە بە هەشتی سەر ڕوویی زەمینە

زۆر بەداخەوە دابەش کراوی
بۆ چوار دەولەتان پیشکەش کراوی

ـ دناڤ هەلبەستێن ب زمانێ عەرەبیێن یێن ئەڤێ دیوانێ گەلەك جۆران ب خوەڤە دگرن، لێ هەلبەستا ب ناڤێ "کورد الموصل" باسێ ئەو نەخوەشیێن

کوردان ل مویسل برین دکەت، کو بازێڕێ مویسل بۆ کوردان وەك گرتیخانەیا هەتاهەتایی ل قەلەم ددەت د چەند مالکێن وێدا دبێژیت:

سجن مؤبد ومنشأ كل الداء
لبني الشمال مدينة الحدباء
لا يرحمون غريبهم فقلوبهم
قاسية كالصخرة الصماء

- هەلبەستڤانی سێ هەلبەستێن خوە ب زمانێ فارسی ڤەهاندینە و بێ ناڤونیشان بوون، مە هەوڵدا ناڤەکێ گونجای ژ هەلبەستێ هەلبژێرین. کو پێکهاتینە ژ: "تشنه لب"، "فرخنده سرشت" و "گوش کن".

- ل داویێ سوپاسیا خودایێ مەزن بۆ ئەو هێز و شیانێن داینە مە، هەروەسا سوپاسیەکا تایبەت بۆ کوڕێ هەلبەستڤانی بەرێز (پ. د. عەبدولفەتاح بوتانی) کو پشتی ئەم بووینە جهێ باوەریا ئەوی، تەڤایا پێزانینێن ژیاننامەیا هەلبەستڤانێ ئەڤێ دیوانێ ژ یادداشت و هەر سێ پەرتووکێن ئەوی یێن ب ناڤێ (صفحات من الذاكرة الموصلية، مجموعة مقالات ومقابلات ومواضيع عن تاريخ الموصل)، (وثائق عن الحركة القومية الكوردية، ملاحظات تاريخية ودراسات اولية)، (منطقة بادينان ١٩٢٥- ١٩٧٠ دراسة في الوقائع السياسية ج١-٢) هاتینە وەرگرتن، سەرەڕای ئەوێ چەندێ هەر ژ دەستپێکا کاری هەتا دویماهیێ بەردەوام دگەل مەدابوو و کێماسی د ڕێنەمایی و پشتەڤانیکرنێدا نەکر. هێڤیدارم ئەڤ کارە ببیتە جهێ مفا وەرگرتنا تەڤایا هەلبەست دۆستان.

د. فاخر حەسەن گولی

دهۆك ٢٠٢١

## گردەپان[1]

گردەپانە[2] دیێ ئیمە خۆشە و دەرمانی دڵە
زەوییەکانی بەرز و نزمن بەشێکیان زۆرگ و ملە
چەند ساڵ لەمە و پێش ڕووبار و باغ و باغاتی هەبوو
ئیمرۆ گشت دانیشتوانی لێ دەکەن هیشکە مەلە
دەنگی بەهرام و جبۆ کۆر و چرکەی فرینی پۆڕ دەهات
جێگری ئیمرۆ ئەوان هوپ هوپی گوندە بۆ و فڕینی قەلە
لانی شێران بوو ڕۆژانێك شاخ و داخی گردەپان
داخەکەم جێگرەکانیان ئیمرۆ ڕێوی و چەقەلە
زۆر لەوان جوتیارن و پیشەیان هەر کشت و کالە
هاوینان لاڤ لێ دەدەن و بەشێکیان جەوال لە ملە
خۆ دەزانی ڕێژەکی زۆر لە خەلە و خەرمان بەفیرۆ دەچێت
بۆ ئاغا و بۆ میر و مەلا و شیخەکەی چاو بەکلە!
دینی ئیسلام هەشت جۆر هەژاری دەستنیشانکرد بۆ زەکات
نۆ یەمینی بەیدا بووە ئەوش شیخی سەر زلە!
کوردی ئاوارە لە ژێر باری گران پشتی شکاوە
پێم بلێ زەرگ و دەفی دەرویشەکان سودی چییە بۆ ئەم گەلە؟
هەر کەسێ خەبات نەکاتن نیشتمانی سەرکەوێ
مردنی باشترە لە ژینی مەندە مۆر و چەبەلە

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٢٠/٤/١٩٧٤)ێ، ل باژێرێ (مویسل) هاتیە ڤەهاندن.

[2] گوندێ (گردەپان) سەر ب دەڤەرا (بەردەڕەش) ڤەیە.

## ئازادی[3]

زستانی سەخت ڕۆیی ئیمڕۆ کاتی بهارە
دیلی گەلیك ناخۆشە لە ئەم کۆنە هەوارە
ئازادی گەر بۆ تۆ نەبێ ژانە ژیانت
لە شوێنێ گەر سەربەست نەبی وەك کونی مارا
هەردەم لە بەر ئەم دیلیە تۆ ماندوو زەبونی
ناخۆشە ژیانت چ لە دێ بی چ لە شارا
شوێنێکی سەر بەستی تیا بێتن بە هەشتە
ئاسودە دەژی ژینت وەکو خەسرەو[4] دارا
ئەو زەرگ و دەف و تەکیەکەی شێخی ڕدێن پان
کەی سودی هەبوو جارەکێ بۆ ئەم کوردە هەژارا ؟!
زانیاری دەرمانی برینی گەلی کوردە
سوودیی چ بوو بۆ گەلی کورد شێخی بیارە[5] ؟

---

(٣) ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (١٩٧٥/١٢/١)ێ، ل باژێڕێ (مویسل) هاتیە ڤەهاندن.

(٤) خەسرۆ یان خسرۆ (فارسیە) و ڕامانا ( شاه یان پادشاه) ددەت.

(٥) بیارە سەر ب حەلەبچەڤەیە، جهێ شێخێن سووفیێن ڕێبازا نەقشەبەندیانە.

## خۆيندن[٦]

خوێندن بۆ مرۆڤ گەلێك دەرمانە
نە خوێندەواری وەك سەرەطانە

هەر خوێندەوارە ئەبێتە دكتور
هەر خوێندەوار ئەبێ بە پروفيسور

هەر خوێندەواربوو هاكوت دپر
نەوتی دۆزیوە لە باباگرگر

لە خاكی كوردان ئەم زێرە ڕەشە[٧]
هاتو تەدەرەوە كورديش بێ بەشە

وا هاوار دەكا منالی كوردان
لە ناو ئاوێمە و خنكام لە تێنان

مصطەفا خۆشناو و عيزت ئامێدی
لە دونيا دەرچوون بە نائومێدی

موحەمەد مەحموود و خەيرڕوڵلا گشتيان
ناويان زندۆ بی لە مێژوويی كوردان[٨]

---

[٦] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێككەڤتی (١٩٧٥/١٢/٢٨)ێ، ل باژێڕێ (مويسل) هاتيە ڤەهاندن.

[٧] (زێرێ ڕەش) واتە (گاز، پەترۆل و نەفت).

[٨] پشتی كۆمارا مهاباد(كوردستان) هاتی هلوەشاندن هندەك ژ كوردێن عيراقێ ئەوێن كو پشكدار د كۆمارێدا ژ وان ژی هەر چار ئەفسەرێن كورد ب ناڤێن:(عزەت عەبدولعەزيز، مستەفا خوشناو، خەيرڕوڵلا عەبدولكەريم و موحەمەد مەحموود قودسی)، ل دويڤ وێ

# جێگری ئەوان بوو کچی کوردستان
# لەیلی قاسمی[٩] شەهیدی نیشتمان



---

لێبوورینا حکوومەتا ئەوی سەردەمی یا عیراق دەرکری بەرەڤ عیراقێڤە زڤرین، لێ دەولەتا عیراقێ پێگیری ب وێ لێبوورینێ نەکر و هەر چار ئەفسەر ل (١٩ حوزەیرانا ١٩٤٧)ێ سێدارەدان.

(٩) لەیلا قاسم (١٩٥٢)ێ ژ دایکبوویە و ل سالا (١٩٧٤)ێ ژلایێ ڕژیما بەعسیڤە هاتە سێدارەدان..

## پڕ ژانە ژیانم[10]

شەو دێتو وەکو بولبول بێزار دەخوێنم
بیمارە دلم خوێن دەتکێتن لە برینم
کاتێ نەبووم ئاسودە لە بەر گریە و نالین
پڕ ژانە ژیانم لە بەر ئەم شیوەن و شینم
چەند ڕۆژێ لە ئەم زەویە دەکەم سەیر و تەماشا
ئەنجام ئەمەیە بەردێ دەپێتن بە سەرینم
بۆ چ هاتوومە ئەم زەویە و بۆ کوێ دەچم دواجار
کارم چییە ئێستاکە وەکێ دێتەوە شوینم
گەر یەکێ بلێ پیسە ئەم کۆنە هەوارە
پێم گالتەیە ئەم گوتنە و سەر دەهەژینم
ئەو پارەو پوولی کە هەم لێتە دونیا
گەریەکێ هەژار داوا بکا دەخورێنم
بێ هۆ دەیە ئەو کوشش[11] و کۆ کردنی ئێمە
ترسان لە خودا باشترە لە هەر کارێ بینم
پێم نالێ چ ل سوودی ژیان کاتی جوانی
شەرمندە[12] گونە بارم و چوون چاوم هەلێنم

---

(10) ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەفتی (١٩٧٦/١/٢)ێ، ل بازێڕێ (مویسل) هاتیە ڤەهاندن.

(11) کوشش (فارسیە) و ڕامانا (بزاڤ و هەوڵ) ددەت.

(12) شەرمندە ـ شەرمەندە (فارسیە) و ڕامانا (کەسەکێ بکەڤیتە د تایێ شەرمێدا) ددەت.

## شەویك لە شەوان[13]

شەوێك لە شەوان تاكو بەر بەیان
چاوم نەچووە خەو لە داخی كوردان

لە دیاربەكرەوە تا كێوی حەمرین[14]
كەركووكی خۆمان تاكو خانەقین

پایتەختی بابان[15] شاری سولیمانی
نێژ ڕاوەكانی گردی سەیوانی

هەولێری غەمگین كۆیە و ڕەواندوز
ڕانیە و پشدەر تاكو قەلادز

لە یادم دەرچوو جزیری بۆتان
كۆنترە ئاوا بی لە سەر ڕوی جیهان

گەلی عەلی بەگ زۆزك و بێخال
پیرەمەگرون و ناوچەیی چەمچەمال

ئاو و ڕووبارو باغ و میوەجات[16]
لە هەر شوینكی لە سەروی و ولات



---

(13) ئەڤ هەلبەستە ل ڕێككەڤتی (١٩٧٦/١١/٢٢)ێ، ل باژێڕێ (مویسل) هاتیە ڤەهاندن.

(14) زنجیرە چیایێ حەمرین، سنۆرێ باشوورێ كوردستانێ یە كە دبێژنێ (چیایێ كوردان).

(15) میرگەها بابان.

(16) فێقی.

خۆشی و سەیرانی کاتی بەهاران
بۆ کوڕ و کچ و هۆگر و هەڤالان

ئێوارە داهات دەچنە مەر دۆشین
گۆڕانی تازە کچانی شیرین

کە بێرێ دەچیت تور لە مل دەکا
کچی ئەورپا شەرمی لێ دەکا

بە کراسی جوان و بە کەواێ گوڵدار
چاروگیان جەرجیت[١٧] سەریان بەهیزار

---

(١٧) جۆرەکێ پەڕۆکایە.

## خۆیندنی فەقیان[١٨]

بـــاوکم "یـــەحیـــا یـــە" دایکـــم"ڕەحیمـــە"
لـــە دێـــی پونگینـــە لـــە دایـــك بوویمـــە

بـــاوکم مـــەلا بـــوو بـــێ موچـــە و بـــەرات
ژیانمـــان بـــەســـەربـــرد بـــە "فتـــرە و زەکـــات"

یـــەك لـــە جیهـــاتی پارێزگـــای هـــەولێـــر
ناوچـــەی مـــەخمـــووری شـــارۆچکەی گـــووێر

نـــاوی ئـــەم دێیـــە ماجـــداوا بـــوو
نێـــزك لـــە هـــەشـــتا جوتیـــار تیـــابوو

ڕۆژەك لـــە ڕۆژان بـــاوکی شـــیرینم
ســـیپاری نووســـی تـــا لـــێ بخـــوینم

کـــاتی پـــاییز بـــوو خوێنـــدنم ئـــەلـــف و بـــێ
عوســـمانیەکـــان چـــون ئنگلیـــز گـــەییـــەجـــێ

شـــەش مـــانگی خایانـــد ختـــمم کـــرد قورئـــان
کـــە ئـــەو دەرمانـــە بـــۆ هـــەمـــوو دەردان

چـــوار کتێـــبم خوێنـــد لـــە دوای قورئـــان
"اســـــماعیل نامـــــە" دووەم ناگهـــــان

"بیـــا داود" بـــوو هـــی ســـێیە مینیـــان
کتێبـــی چـــوارەم نـــاوی" باغبـــان"

---

[١٨] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (١٩٧٧/٤/٢٥)ێ، ل باژێرێ (مویسل) هاتیە ڤەهاندن.

هەر چوار فارسی بە دەست نوسراون
بۆچی ئێستاکە هیچیان نە ماون

لەپاش ئەوانە کتێبی ئەحمەدی
پێ دەڵێن ئێستە فەرهنگی کوردی

"عەوامیلەکەی" شێخی جۆڕجانی
لەگەل تەصریفی شێخی زەنجانی

"سەعدوڵلا" گچکە بـ "مغنی" و "إظهار"
سەعدوڵلا لە صەرف ولە فقهیش" انوار"

"سەعدوڵلا"ی گەورە و کتێبی جامی
گەشتیە مەرفوعات مەلا تەمامی

لە دوای ئەوانە مەنطق و ئاداب
بەیان و بەدیع و رساڵەی حیساب

"جمع الجوامع" و "تشريح الافلاك"
شەوی تاریك بۆت دەكاتە ڕۆناك

ئەو دێ بۆ ئەو دێ لەم شار بۆ ئەو شار
خایەندنی خوێندن بیست ساڵ بە ژمار

بە زكیكی تیر بەدوانی برسی
كاتی كزو مات لە بەر بێ دەرسی

خواردنی ئێواران دوینە و دوغەوا
ساوار بەتۆلكە دەرمانی خەوا

فەیدو تە زبیب و شەرح و حاشیەكان
هەر وەكو زنجیر خستیانە پێمان

زەید لە عەمر و ئەکەر لێ بدا
قازانجت جی یە بۆ راهی خودا

مێژوو فێرنەبووی یا پیشەسازی
بە "قال و قیل" عەرەب دەنازی

وای تێ گەیاندی مەلای قرتە بۆز
مێژوو بخوێنی پێ دەبی ئالۆز

## شاخ و کێویی نیشتمانم[١٩]

شەویکی تووش و توند و هەور و باران
سەرم سورمابوو دەمکرد یادی یاران
چ خۆش ئەو ژیانەی چوو لە لادی
لە کوردستانی بەهدینان و سۆران
گەلی کورد وەکو شیری ژیانن
چ بەرواری چ شیروانی چ گۆران
وەکو باز و شەهین گەنجەکانیان
کوریان "غلمان"ە "حور العین"ە کچیان
دیاربەکر و جزیرە و مووش و خەرپوت
سەنەندەج و مەهاباد و مەریوان
سولەیمانی و حەلەبچە و شاری کەرکووك
دهۆك و دەشتە زێ و خاکی بارزان
گەلێ ماون بە من نائێتە ئەژمار
بەهەشتی سەر زەمینە شاخ و کێومان
لە یا هوی کوترە کێوی و قەب قەبی کەو
چریکی پورۆ بارەی بەرخ و کاران
چ خۆشە دەنگی شمشالی شوانان
چ خۆشە ورشەورشی داروباران
چ خۆشە هاژە هاژی جۆ و رووبار
لە کاتی پاییزدا دانەی ئێواران

---

[١٩] ئەڤ هەلبەستە ل رێککەڤتی (١٩٧٩/١/٢)ێ، ل باژێرێ (مویسل) هاتیە ڤەهاندن.

# ژيانم[20]

لــــه دوای شـــيخی جزيـــری تـــاكو ئيســـتا
لـه نـاو بۆتـان كـەسـی وەك مـن هـەل نـەسـتا
ژيــــانم تاڵــــــه زۆر مـــــــات و زەبـــــونم
خـــودا كـــەی تێـــك دەچـــی ئـــەو دار ودەســـته
ژيـــان و ســـود بـــــەمنــــداليم نــــەزانـــی
لـه گـەنجـين دا مـروڤ سـەر خـۆش و مـەسـته
بـه مـن نـالێ (عـەلـی) كـەی خـوای دەناسـی
بــەرامبــەر خــوا بــه پيـری بــەنـدە سسـته

[20] ئەڤ هەلبەسته ل سالا (١٩٩٠)ێ، هاتيه ڤەهاندن.

# من و مەلای جزیری[21]

له كاتی خۆی جزیری وەك من ئاسای رەش و ڕووت بوو
له سایەی چاوی سلمی پایه بەرز و خاوەن دیوانه
چ ئیكسیرێكه دلداری له دنیا جت به سەر دێنی
هەمیشه بەندەیه عاشق كەچی مەعشوقه سولطانه
زەماوەندی (حەسەن كیف) بو مەلای تیغێكی خوین ڕێژبوو
كەجوو نەیزانی گەرداوە لەلای وابوو كه سەیرانه



[21] ئەڤ هەلبەستە ل سالا (١٩٩٠)ێ، هاتیە ڤەهاندن.

## هەرشەمی[٢٢]

جـێ نیشـن بابـە گـەورەم خۆشـەویسـتم هـەرشـەمـی[٢٣]
زۆر سـوپاس بـۆ خـوا کـە بابـان کـۆر نـەبـووم
وام دەزانـی خـەم دەخـۆم خـوێنی جگـەر خۆراکمـە
تووکـە پشـکفتی لـەنـاو بـاغی کـەمـال خـەم خۆرنـەبـووم
تێگـەیشـتم قۆلـە دەریـا ترسـی خنکـانم هـەبـوو
بـێ تـرس دەربـازی ئـەو بـەر بـووم و هـیچ بـەربـۆر نـەبـووم
باغـەکۆنمـان نـەو بـەهـارە پـڕ گـوڵ و گـوڵ چـیچکن
ئـاوەدانـە هـەروەکـو جـاران و مـن سـەرشـۆڕ نـەبـووم

---

[٢٢] ئەڤ هەلبەستە ل سالا (١٩٩٠)ێ، هاتیە ڤەهاندن.

[٢٣] گوندێ (هەرشەم) دکەڤیتە چیایێ پیرمام (مەسیف سەلاحەددین). جهێ ژدایکبوونا شێخێ ڕێبازا نەقشەبەندی موستەفا هەرشەمی یە. مەلا عەلی بۆتانی ل دویڤ ڕێبازا نەقشبەندی دچوو و کەسەکێ نێزیکی شێخ موستەفایێ هەرشەمی بوو. کو ئەڤ هەلبەستە ژبۆ شێخێ خوە ڤەهاندیە.

## شەوی تاریك[٢٤]

له هاوارم وەرن یاران به جێ ماوم له كاروانی
حیاه الذل والموت لدی الانسان سیانی
به پێخواسی به جێ ماوم لەناو بەردان و دڕك و دال
فكیف الحال في التیهی اذا راجعت وجداني
سرود و آه و گریانم فیغان و گەرمە فرمێسكم
فحزني لیس مجهول لدی القاصي او الداني
شەوی تاریك وگرمەی هەورو باران وسەرما
سوی رب السموات الی من اشكو اشجاني
سەر و ریشم وەكو لوكه بەشەو بەستم له بەركوكه
لذا استنكفوا مني احبائي وخلاني
ژیانی خۆشو دلپاكی بەیەزدان باوەڕی كردن
فدین الله والاخلاق عند الله صنواني

---

[٢٤] ئەڤ هەلبەستە ل سالا (١٩٩٠)ێ، هاتیە ڤەهاندن.

## کوردستان[٢٥]

کوردســــــتانمان خـــــاکی ڕەنگینـــــە
پارچــە بــە هــەشـتی ســەر ڕوویــی زەمینــە

زۆر بـــــەداخــــــەوە دابـــــەش کــــــراوی
بــۆ چــوار دەولــەتــان پیشــکەش کـراوی

کێــوە کانیشــت وەك کێــوی"طــورن"[٢٦]
بۆیـــە بێگانـــــە هـــــەر بــــۆی دەلـــورن

حـــــەیـــــف و مخـــــابن داگیـــــر کـــــراوە
لــــە چــەنگــی زۆر دار هــیچ نــەحــەســاوە

چـــاوم هــــەلبڕیـــی بـــۆ ســـولەیمـــانی
لــــە گورســـــتانی گـــــردی ســـــەیـــوانێ

هاتـــــەوە یـــــادم زانـــــانی کـــــوردەکـــــان
فــائق بــێ کــەس[٢٧] و مامۆســتا گـۆران[٢٨]

حـــاجی قـــادر[٢٩] و عـــەلـــی حـــەریـــری[٣٠]
ئـــەحمـــەدی خـــانی[٣١] ومـــەلای جزیـــری[٣٢]

---

[٢٥] مێژوویا ڤەهاندنا ئەڤێ هەلبەستێ نەهاتیە نڤیسین.

[٢٦] چیایێ ناڤدار ب (تۆر).

[٢٧] فایق عەبدوڵلا بێکەس (١٩٠٥-١٩٤٨).

[٢٨] عەبدوڵلا ناڤدار ب گوڕان (١٩٠٤-١٩٦٢).

[٢٩] حاجی قادر کویی (١٨١٧-١٨٩٧).

[٣٠] عەلی حەریری (١٤٢٥-١٤٩٥ز).

لـەبیـرت نـەجیـت مـەلا کـەی گـەورە[٣٣]
گوفتـــارەکـــانی وەك گۆلـــەی هـــەورە

بـانگی کـورد دەکـەن پشـتتان ببـەسـتن
هوشـــیار ببنـــەوە لـــە خـــەو هـــەلسـتن

"فیتنـــام" ئێســـتە کـــە بـــۆ خـــۆی ئـــازادە
بــــۆ کــــوردی هـــــەژار دادم بـــــێ دادا

چـەنـد هـاوار دەکـەن ڕۆشـەنبیـرەکـان
بـۆ کـور و کـچ و جـوان و پیـرەکـان

یـــەك و دوو بگـــرن بـــە دلێکـــی پـــاك
بـــە چـــرای زانیـــاری ڕێ بکـــەن ڕۆنـــاك

بچـــــووك بنێـــــرن بـــــۆ قوتابخانـــــە
خوێنـــــدن بـــــۆ ئێمـــــە دار و دەرمانـــــە

ئێســـتا منـــدالی بکـــە دەســـت و بـــرد
لـە دوادا نـەلـێن چـم لـە گـەلـم کـرد

---

[٣١] ئەحمەدێ خانی (١٦٥٠-١٧٠٧).

[٣٢] مەلا ئەحمەدێ جزیریێ ناڤدار ب مەلایێ جزیری (١٥٧٠-١٦٤٠).

[٣٣] مەلا موحەمەد جلیزادە (الگویی) د بنیاتدا خەلکێ بۆتان بوو.

## باپیر و نەرمین[٣٤]

باپیر دەلێت ئەی ئافرەتەکە
ئەو ڕۆژە چوومە مالی شێخەکە

لایەك تەرەکتەر لایەك تورمبیل
لایەك بزن و مەڕ لە لایەکیش چێل

دوو دەڕ ڕاسەی نو و چوار قلابە
بۆ ئەو زۆر باشە بۆ من خرابە

شێخ ژنیش دەرکەوت بە زەردە خەنە
لە ملی خەناوکە و توق و بەر بەنە

چەن تۆ حەزبکەی لە زێر و زەبەر
هەر لە بنی پێی تاکو تۆقی سەر

جووتی نەکردوە نەی وەشاندیە بێل
خری کردووتەوە هەموو بە فڕ و فێل

نەرمین پێ دەلێ تو خودا پیاوەکە
ناوی خوا بێنە ئەم گوتنە نەکە

خۆت گرفتار و گونەهکار نەکا
گەلەك دەترسێم نە مێردت بکا

---

(٣٤) مێژوویا ڤەهاندنا ئەڤێ هەلبەستێ نەهاتیە نڤیسین.

# چوونی جوتیار بو ماڵی شێخ[٣٥]

باپیر ئەم جارە ڕوی کردە نەرمین
ڕوبکە ینەکێ؟ بو لای کێ بچین

ووتی ئەی ئافرەت من وەختە بمرم
تەنها شێخ ماوە دەستی پێ بگرم

پێ گوت پیاوەکە ما تۆ مندالی؟
دەچیتە لای شێخ بە دەست بەتالی

مام باپیر گوتی قوڕەکم بەسەرم
گەنم و جۆ نەما نەختێ بۆی بەرم

نرمینیش پێی گوت دوو مامری سەرە
لەگەل بیست هێلکە بۆ شێخی بەرە

باپیر هەلستا لەگەل بەیانی
مریشک و هێلکی دانا سەر شانی

جوتیار گەیشتە دێ لەگەل ڕۆژهەلات
لە قیژەی مامر شێخ بە خەبەر هات

کارەساتەکەی بۆ شێخ گێراوە
گوتی بە قوربان هیچم نەماوە

تالانی کردم ئەو ئاغای بەد فەر
چی بۆ نەهێشتم نەهیشک و نەتەر

---

(٣٥) مێژوویا ڤەهاندنا ئەڤێ هەلبەستێ نەهاتیە نڤیسین.

شـێخ گـوتی (بـاپیر) ژیـان هـیچ نیـه
مـالّی دینامـان قرێـژێ دەسـتی یـه

ئاغاکـەی ئیـوه زۆر خانـه دانـه
خـودان دیـوان وسـفره وشـیلانه

ئـەو عـەرد و بانـەی لـه دەسـت ئاغایـه
خـودا پیـێ داوه بـەنـده نـاس خوایـه

هـەر بـۆ ئـەو باشـه پـاره و دەغـل ودان
ئـەتـو بۆچیتـه چـاو شـۆڕی مـل پـان

## جوتیار لە گەل ئاغاو مەلا وشێخ[٣٦]

نەختێ بۆت بکەم باسی جوتیاران
گەر پسیار دەکەی جارێك لە جاران

چۆن بوو ژیانییان لەگەل دەرەبەگ
چ ئاغا بیتن یا میر بێ یا بەگ

لە کاتی پاییز دای دەبەستا جووت
دوو یختەی مل کول ئەندام ڕەق و ڕووت

جووتیان پێ دەکا بە شەرە مەترەق
پێخۆری میوژ لەگەل نانی ڕەق

چەندێك خەریکە بۆ کشتوکاڵە
بە ڕۆژ جووت دەکات بەشەو لە ماڵە

کە بهار دەهات باران بڕانە
ڕووی لە ئاسمانە ئەو بەستە زمانە

دەچتە لای مەلا تکای لێ دەکا
بۆ نوێژی باران تەنگاوی دەکا

مەلا پێ دەلێ ئەی کاکی جوتیار
تۆ بە ڕۆژ و بە سێ ڕۆژ ئەژمار

لە ڕۆژێ سێیەم لە دێ دەچتە دەر
دەپاڕێنەوە قوڕ دەکەن بە سەر

---

[٣٦] مێژوویا ڤەهاندنا ئەڤێ هەلبەستێ نەهاتیە نڤیسین.

هـەورێکـــی رەش دێ زۆر ســەخــت وتونــدە
بــاران دێتــە خــوار وەك دەرکــی کونــدە

کـــەجـــۆ زەرد دەبـــێ دەچتـــە دروونـــە
پشـــتی دەئێشـــی مــــات و زەبوونـــە

کــە نیــورۆ دەهــات بــە دوو نــانی جــۆ
پێخـــوری باشـــی دوو ســـێ ملاکـــە دۆ

گـــــورانی دەلـــێ داســـی دەکێشـــی
لـــەم مانـــدو بوونـــە گیـــانی دەئێشـــی

ســـەرت نـــەیێشـــم دەیدورتیـــەوە
دەیباتـــە خـــەرمـــان ئـــەیکوتیتـــەوە

لــەدوای شــەنـەبـا دەیکاتــە ڕەوســە
لـــەم کـــارەســـاتە ئینجـــا بترســـە

ئــەوە ئاغــا هــات لــەگــەل دوو نوکــەر
یــەك بــەدەمانجــە یــەکێــك بــە خــەنجــەر

پــێ دەلــێ هــەستە بیکــە بــە پێنج کـۆم
چــواری لــە بـۆ تـۆ یــەکێکـی بـۆ خــۆم

حۆقــەکــی مــەدە هــەژار و فــەقیــر
حەس حەس و مەلای هیج نەکەی لەبیر

بــۆ شــێخی خۆشــت هــەنــدێك بنێــرە
لــەبیــرم دەرچــوو ئــەو گــەلێــك خێــرە

جوتیـــاری هـــەژار ڕوی کـــردە ئاســـمان
شـــەنـــەکـــەی داری دانایـــە ســـەر شـــان

## جوتیار و مەلا(٣٧)

جوتیـــار ئـــەلێتـــە ژنـــی نـــەرمینـــە
دەچمـــە لای مـــەلا کۆلـــەگـــەی دینـــە

بـــۆ پێغـــەمبـــەری ئـــەو جـــێ نشـــینە
ئـــــەوان چرانـــــە بـــــۆ ئـــــەو زەمینـــــە

گـــورج هـــەلســـتا کـــەوشـــی کـــردە پـــێ
بـــۆ مـــالی مـــەلا خـــۆش خـــۆش کـــەوتـــە رێ

گـــــوتی مامۆســـــتا لێمـــــان بپرســـــە
تکـــام بـــۆ بکـــە لـــەو خودانـــە ترســـە

هـەرچـی چـەنگم کـەوت لـەخـەلـە و خـەرمـان
پـــاکی لێســـتاندین چـــی نـــەهێشـــت بۆمـــان

کتێبـــــی دانـــــا مـــــەلای ئـــــاوایی
ســـەری خـــۆی هـــەژانـــد زۆر بـــەوەســـتایی

گـــوێ بگـــرە بـــاپیر خوشـــەویســـتی خـــودا
ســـێ رۆژ لـــە مـــالی ئـــاگر هـــەل نـــەکـــرا

ســـەحابـــەش وەك ئـــەو زۆر دەبـــون برســـی
وەك ئـــەوان بکـــە گـــەر لـــە خـــودا دە ترســـی

ئاغـــــای ئێمـــــە زۆر پیـــــاوی باشـــــە
پـــارە و دەخـــل و دان هـــەر بـــۆ ئـــەو باشـــە

---

(٣٧) مێژوویا ڤەهاندنا ئەڤێ هەلبەستێ نەهاتیە نڤیسین.

وامان زانیوه لەدەوری دەوران
ماڵ هەر دا بەشە بۆ برا گەوران

خودای گەورە لە ئەم دونیایە
بەردی بچوك و گەورەی دانایە

ئەوەی ئێستا کە پاڵت پێ داوە
دو جەواڵ گەنم و چۆی بووم هیناوە

هەرو دانیشە لە دیوانخانە
نەکو دەتخاتە ناو بەندیخانە

بەدڵێکی ناخۆش بۆ ماڵ گەڕاوە
نەختێکی دانیشت ماندوی حەساوە

# يا امة الكرد[٣٨]

يا امة الكرد قد خان بك القدر
دمعي عليك من الاحزان منهمر
فالعابثون بشعب الكرد هم بشر
ليسوا بانسان بل انهم بقر
اذا ذكرت حقوق الكرد عندهم
هزوا الرؤوس ومن اقوالك سخروا
فأرضهم جنة والماء كالعسل
جبالهم ذهب احجارهم درر
وفي الربيع اذا زرت موطنهم
فيه الجمال وفيه الماء والخضر
ذكاؤهم خارق وهم عباقرة
مواطن الكرد بالعلم تشتهر
فذو تراث وذو علم وذوا ادب
بالعلم والنور كردستان تزدهر
اعدد مآثرهم سجل محاسنهم
ان المكارم فيهم ليس تنحصر
لو أوقدوا النار ليلا في مصائفهم
من سحر منظره قد يختفي القمر

---

(٣٨) ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٣/١١/١٩٧٥)ێ، ل باژێڕێ (مویسل) هاتیە ڤەهاندن.

زر في الاصيل جبال الكرد ترى

ماء الحياة من الوديان ينحدر

ان صح ما قيل في خضر النبي فقد

تحظى به في جبال الكرد يستتر

## كورد الموصل[٣٩]

سجن مؤبد ومنشأ كل الداء

لبني الشمال مدينة الحدباء

لا يرحمون غريبهم فقلوبهم

قاسية كالصخرة الصماء

ويل لاكراد العراق فانهم

يتخبطون كخبطة العشواء

هجروا اماكنهم ومسقط رأسهم

فهددوا واكرهوا من جانب الجبناء

كنس الشوارع او صبغ الحذاء فقط

وقف على اكرادنا النجباء

تهجيرهم تعريبهم تشريدهم

قد دبرت وهذه مكيدة الأعداء

صانوا تراث العرب ودين محمد

من عبث الشيطان والجهلاء

ثاروا على المستعمر في حينه

ببسالة وشجاعة واباء

وفي الختام قد ابيح قتلهم

جوزيت يا ابن الكرد خير جزاء

---

(٣٩) ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (١٩٧٥/١١/٥)ێ، ل باژێڕێ (مویسل) هاتیە ڤەهاندن.

داء خبيـــث يســـري فـــي عـــروق الشـــعوب

داء التعصـــــب يـــــا لـــــه مـــــن داء

كيـــــف النجـــــاة ومصـــــائر شـــعبنا

مرهونـــــة فـــــي ذمـــــة الـــــدخلاء

أمـــــن المـــــروؤة أن تهـــــان امـــــة

مزدانـــــة بفضـــــائل العلمـــــاء!!

أمـــــن العدالـــــة ان تـــــراق دمـــــاؤهم

تلـــــك لعمـــــري ســـــيرة الســـــفهاء!!

## قم يا علي[٤٠]

قـــــم يـــــا علـــــي ودع القـــــال و القيـــــل
فتـــــزود بالصـــــلاح وتاهـــــب للرحيـــــل
هجـــم الشـــيب علـــى شـــرخ الشـــباب العبـــق
لا رجـــوع للشـــباب فهـــو امـــر مســـتحيل
فحـــذار ان تمـــار فـــي حســـاب او عقـــاب
داو جـــرح الريـــب والافكـــار بالصـــبر الجميـــل
وابتـــغ فـــي هـــذة الـــدنيا جليســـا صـــالحا
ذاك حـــق يحشـــر المـــرء علـــى ديـــن الخليـــل
صـــاحب الاخيـــار دومـــا واجتنـــب
زمـــرة الاشـــرار هـــم ضـــلوا الســـبيل
وتواضـــع مســـتكينا لا تفـــاخر ابـــدا
واردع الـــنفس الخبيثـــة انـــك عبـــد ذليـــل

---

(٤٠) ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (١٩٧٦/١٠/٣٠)ێ، ل باژێڕێ (مویسل) هاتیە ڤەهاندن.

# طلب العلم[٤١]

كم سهرنا في ليالي نطلب العلم الثمين
آملين ان نكون من هداة العالمين

ثم اصبحنا مع الجهال هم بئس القرين
ما جنينا غير آهات واقوال مشين

شاءت الاقدار ان نسبح في بحر الخيال
ذهب سن الشباب في الخصام والجدال

لا نبالي ما جمعنا احرام ام حلال
انحرفنا عن طريق الخير آثرنا الضلال

لم نسر يوما من الايام في نهج قويم
ذهب العمر سدى كالدر في جيب اليتيم

فسواء عندنا العصر الحديث والقديم
اسفا قد بادر الناس الى الفعل الذميم

---

[٤١] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (١٩٧٦/١١/٣)ێ، ل باژێڕێ (مویسل) هاتیە ڤەهاندن.

# ايها الانسان[٤٢]

ايهـــا الانســـان مـــا غـــرك بـــالرب الكـــريم
فـــدع المعـــوج واســـلك الصـــراط المســـتقيم
لا تبـــع الآجلـــة بالعاجـــل واحـــرص علـــى
عمـــل الخيـــر لكـــي تنجـــو مـــن نـــار الجحـــيم
هـــون المشـــي علـــى الارض وحـــاول ان تكـــون
عبـــد رحمـــن ولا عبـــدا لشـــيطان رجـــيم
انمـــا عمـــر الفتـــى حلـــم كمـــا يلمـــع آل او كـــثلج
ذاب مـــن طـــيش الحـــرارة بـــات فـــي حكـــم العـــديم
ســـنة اللـــه جـــرت فـــي الخلـــق فـــي كـــل العصـــور
ان يهـــان الحـــر والانـــذال دومـــا فـــي النعـــيم
كـــم يفـــوز الثعلـــب بالجيفـــة فـــي غابـــة
ويـــئن الليـــث جوعـــا يجتنـــب فعـــل اللئـــيم
كـــن شـــريفا مـــت عفيفـــا قـــاس آلآم الحيـــاة
لا تعـــش عـــيش المذلـــة انـــه أمـــر ذمـــيم

---

[٤٢] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (١٩٧٦/١١/٢٦)ێ، ل باژێڕێ (مويسل) هاتیە ڤەهاندن.

## ادرك الناس[٤٣]

ادرك النـــاس بـــان العلـــم نـــور وضـــياء
فبنـــور العلـــم تـــم اختـــراع الكهربـــاء
يســـتفيد الخلـــق فـــي كـــل الفصـــول نـــافع
للحـــرارة والبـــرودة ولتبريـــد الميـــاه
ذلـــل العلـــم مســـافات الطـــوال كـــل حـــين
قـاطرات فـي البـراري بـاخرات فـي البحـار طـائرات فـي الهـواء
فكـــر الانســـان جـــيلا بعـــد جيـــل
آمـــلا مســـتهدفا غـــزو الفضـــاء
دون جـــدوى خـــاب ســـعي الاولـــين
كســـراب فـــي بقيـــع يحســـب الظمـــآن مـــاء
شـــهد الجيـــل الجديـــد روعـــة لا تنكـــر
انجـــز العلـــم الحـــديث كشـــف اجـــرام الســـماء
طـــاف حـــول الارض مشـــيا فـــي القـــرون الخاليـــة
ابـــن بطوطـــة ومـــاجلان قـــد ذاقـــا الجفـــاء
"يـــوري كاكـــارين" حـــذا حـــذوهما
لـــم يـــذق طعـــم المشـــقة طـــار ردحـــا فـــي الفضـــاء
بـــات أيامـــا عديـــدة مـــن علـــى ســـطح القمـــر
باحثـــا عـــن الحيـــاة فـــي الخفـــاء
فـــاز أهـــل الغـــرب حـــذانا لصـــنع المعجـــزات
نحـــن شـــرقيون مرضـــى فاقـــدين للـــدواء

---

(٤٣) ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٢٨/١١/١٩٧٦)ێ، ل باژێڕێ (مویسل) هاتیە ڤەهاندن.

## بمناسبة عيد الاضحى المبارك(٤٤)

جلب العيد السعيد فرحة للموسرين

بيد أن الحزن زاد في قلوب المعدمين

ان أرباب الثراء في قصور كالجنان

عيشهم عيش رغيد شربهم ماء معين

مترفون في المسرات مع الحور الحسان

في امان وسلام وعلى سرر موضونة متكئين

يسكنون في قصور نقشت جدرانها

هذه جنات عدن فأدخلوها خالدين

ونرى المعدم في كوخ وضيع قلما

في الصباح والمساء يذرف الدمع السخين

ويرى أسرته في حالة يرثى لها

في ثياب رثة أوضاعهم مزر مشين

يرتدي ابن الغني بدلة زاهية

مشرق الوجه جميل شبه زهر الياسمين

وتفرس في وجوه قد علتها الغبرة

لا تسالْ عن أحد تلك وجوه البائسين

---

(٤٤) ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (١٩٧٦/١٢/٢)ێ، ل باژێرێ (مویسل) هاتیە ڤەهاندن.

## دجلة[٤٥]

دجلــــــة الخيـــــــر و يــــــا ام الحــــــدائق
فبمــــــاء العـــــذب تســـــقين الـــــورد والشــــقائق
أنـــت تجـــرين طـــوال الـــدهر فـــي ارض العـــراق
لانهـــا بـــين مـــــن الجـــور ولا مـــــن اي عـــائق
ذات يـــــوم كنـــــت امشــــي علــــى ضــــفتها
داهمتنــــي خلجـــات القلـــب عـــن جمـــع الوثـــائق
بعـــــد تفكيـــــر عميـــــق رمـــــت ان اســـئلها
كـــــي افـــــوز بجــــواب اكتشـــــافا للحقــــائق
كـم فتكـت بانـاس ابريـاء مـن شـباب وشـيوخ
لا تخـــافين مـــــن الســـجن واعـــواد المشـــانق
يرتـوي مـن مائـك فـي الحـر اسـراب الطيـور
مــــــن نســـــور وصــــــقور وحمـــــام وبواشـــــق
وتغاريـد البلابـل دعنـا الفتيـات فـي السـحر
وعلـى الشـاطيء يـزداد الاسـى فـي قلـب عاشـق
ايــن ذو النــون ابــن متــى صــاحب القلــب الســليم
ايـــــن آشــــــور وبانيبـــــال ســــــكان الســــــرادق
ايـن حكـام الجزيـرة ايـن الشـيخ الجزيـري
ايـــن هـــارون الرشـــيد ايـــن هـــم كـــل الخلائـــق

---

[٤٥] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (١٩٧٧/١/٩)ێ، ل باژێڕێ (مويسل) هاتيە ڤەهاندن.

اصـــبح الكـــل ترابـــا رقـــدوا فـــي لحـــدهم

وتركـــت النـــاس حيـــري فـــي الهمـــوم والمـــآزق

أعرضـــت عنـــي وصـــدت لـــم تغيـــر جريهـــا

لا تجـــادلني ودعنـــي فســـأتيك الحقـــائق

بعـــد الحـــاح شـــديد همســـت فـــي اذنـــي

فانـــا او انـــت او هـــم كلنـــا مـــن صـــنع خـــالق

## الشباب والشيخوخة[٤٦]

اخلائي ارحموني انقضى عهد الشباب
عشش البوم على رأسي وقد طار الغراب
ذكرتني ذكريات عشت ايام الطفولة
راودتني امنيات تاه عقلي في السراب
ان داء الشيب داء لا يعالج ابدا
فالدواء لم يسجل في سجل او كتاب
لم يزل مستعصيا داء الهرم منذ القدم
بينما الانسان استعلى على كل الصعاب
بجهاز يجلب الاصوات من الاف الاميال
صوت و زمار و عود و رباب
وتراه في الفضاء دون خوف او وجل
طائرا في الافق مستترا فوق السحاب
سخر البحر الاجاج تجري فيه السفن
في دجى الديجور والامواج حتى لايهاب
صافرات القاطرات في الليالي المظلمة
فهي تسري كالرياح في السهول والهضاب
علم الانسان ما لم يعلم في كل حين
بيد لغز الشيب باق دون حل وجواب
ان من يطرق هذا الباب باء بالفشل
وسيبقى الباب مسدودا الى يوم الحساب

---

[٤٦] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (١٩٧٧/١٠/٣٠)ێ، ل باژێڕێ (مویسل) هاتیە ڤەهاندن.

## في مرثية (حمة شێت)[٤٧]

ارتدى اربيل ثوب الحزن في فصل الشتاء

للفقيد "حمة شێت"[٤٨] انه لبى النداء

فتعازينا الى كل الشباب والشيوخ في البلد

من صغير وكبير ورجال ونساء

وعتابي للاطباء وأرباب الحكم

لم يبالوا بالفقيد بالعلاج والدواء

ويليهم في الخمول أغنياء البلد

تركوه دون مأوى ذاق آلام الشتاء

والحقوقيون صم لادعاء حقه

رفعوا الأمر نهائيا الى قاضي السماء

ليت شعري من يكون خلفا بعد"حمة"

حيث كان عبقريا خالدا حاد الذكاء

عاش شهما بطلا عذب الكلام

كان ذو قول صريح شبه قول الحكماء

---

[٤٧] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (١٩٧٧/٢/٤)ێ، ل بازێڕێ (مویسل) هاتیە ڤەهاندن.

[٤٨] حەمە شێت (دین) یێ ئاقل سڤکبوو، کارێ وی کۆمکرنا ئاسن و... بوو. شەڤ و ڕۆژ ل شەقامێن هەولێرێ د گەڕیا. خودانێن دوکانان ئەو بەرامبەر دوکانێن خوە دەردکر. ل دویماهیێ هەوارا خوە برە مزگەڤتی کو مالا خودێ یە ل وێرێ ژی هاتە دەرکرن. دەسێن خوە بلند کرن و گۆت: ئەی خودێ تو خودانێ هەمی تشتەکیێ پا کانێ ملکێ تە هەوارا خوە ببەمێ" مەبەست ل ڤێرێ زیرەکاتیا وی یە.

ســــــاخرا بالمغريـــــــات وملـــــــذات الحيـــــــاة

همــــه جمــــع الحديـــد فـــي الصـــباح والمســـاء

يرحـــــــل المتجبـــــــرون اســـــوة بالضـــــعفاء

يـــــــدفن المتكبـــــــر بالعويـــــــل والبكـــــــاء

مـــن بكـــى فـــي مـــرض المـــوت عليـــك يا"حمـــة"؟

فلقــــــد كنــــــت غريبــــــا فاقــــــدا للاقربــــــاء

عشــــــت فــــــي الــــــدنيا فقيــــــرا بائســــــا

بيــــــد ان الفقــــــر فخــــــر الانبيــــــاء

هــــل رايـــــت فيلســــوفا بارعــــا او عالمــــا

او نبيـــــا او وليـــــا او صـــــالحا فـــــي الاغنيـــــاء؟

"فغريـــــــق أدب" تـــــــاريخ هـــــــذا البطـــــــل

كلنــــا فـــــان بــــــلا ريــــب ولـلــــه البقـــــاء

يــــا شـــــباب أربيـــــل ان الفقيـــــد لا يريـــــد

أي شـــــي مـــــنكم غيـــــر الـــــدعاء

مارثيـــــت ملكـــــا أو حاكمـــــا فـــــي عمـــــري

شـــــيخ اربائيـــــل اهـــــل للرثـــــاء

# حقول الحياة[٤٩]

تعـــال معـــــي لنلقـــــي النـــــواة
ونجنــــي ثمـــــار حقـــــول الحيـــــاة
ونســـعى لتطـــوير جيـــل جديـــد
ونـــأبى الخضـــوع لعـــرش الطغـــاة
كاصـــحاب الكهـــف أرى شـــعبنا
تـــرى النـــاس يقظـــى وهـــم فـــي سـبات
وهـــا نحـــن نعتـــاش فـــي بلـــدة
بنـــو الكـــرد للـــدين فيهـــا حمـــاة
بأحيـــاء الحـــدباء[٥٠] طـــف برهـــة
ففـــي كـــل حـــي تـــرى المعجـــزات
وقـــد ســـرني الســـير صـــوب الزهـــور
هنـــاك تصـــدر لســـكنى الـــذوات
تعلـــم فـــأن العلـــم ملـــك مشـــاع
فســـيان فيـــه الفتـــي والفتـــاة
حـــذار الركـــون الـــى الظـــالمين
طـــواغيتهم ذو قلـــب قســـاة

---

[٤٩] ئەڤ هەلبەستە ل رێککەڤتی (١٩٨٤/٤/٥)ێ، ل باژێرێ (مویسل) هاتیە ڤەهاندن.

[٥٠] باژێرێ مویسل.

## شكوى الى الباري جل جلاله[٥١]

احمـد اللـه الـذي أبصـرنا نـور اليقـين
وسـلام اللـه هطـالا علـى طـه الامـين

لـم أزل أدعـو الالـه كـل حـين
علنـي أرتـاض يومـا فـي رياض الصـالحين

شـاع فـي الشـرق وفـي غـرب الـبلاد
أسـفا انهـار أخـلاق العبـاد

فصلاح النـاس معـدوم وقـد عـم الفسـاد
لايهـاب المـرء أو يردعـه يـوم التنـاد

هـذه الـدنيا عـروس للشـباب
زانهـا العطـر وألـوان الثيـاب

كقطيـع فـي ربيـع بـات مـا بـين الـذئاب
أو لهيـب النـار فـي عـود الثقـاب

يتمنـى المـرء العمـر المديـد
وشـهي الأكـل واللـبس الجديـد

لا يخـاف أوبيـالي مـن عقـاب أو وعيـد
حبـب المـال اليـه قـال لـي هـل مـن مزيـد؟

---

(٥١) ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (١٩٨٧/١١/١)ێ، ل باژێڕێ (مویسل) هاتیە ڤەهاندن.

خـــيم الجهـــل علــــى ارض العـــراق
لـــو نظرنـــا لا نـــرى غيـــر النفـــاق

ونزلنـــا فــــي جحـــيم لا يطـــاق
نحـــن لانـــدري الـــى ايـــن نســـاق؟

كـــم وضــــيع ارتــــدى زي أميـــــر
وشــــريف نومــــه فـــوق الحصــــير

ليتــــه يشــــبع مــــن خبـــز الشــعير
وهـــو لا يـــدري الـــى ايــن المصــير؟

فـــوق هـــذا لـــيس مرتـــاح الضــمير
مـــن عقـــاب اللـــه فـــي اليـــوم العســير

حيـــــث لايعلـــــم عبــــدا وأميـــــر
خلـــــق للجنـــــة أو للســــــعير

نحــــن كالانعــــام نرعــــى فـــي فـــلاة
يمــــرح الفتيــــان فينــــا والفتـــــاة

وتوســــــطنا الـــــذئاب والعصـــــاة
ونـــرى الراعـــي فـــي عمـــق الســـبات

## (تشنه لب)[٥٢]

بـــر لـــب دريـــا عمـــان تشـــنه لـــب درمانـــده‌ام
ســـالها خـــواهم كـــه آزاد شـــوم هـــر بنـــده‌ام
ايـــن چـــه تشـــويش چـــه آشـــوب كـــه بـــر مـــا بگـــذرد
چـــون فرامـــوش ميكـــنم ايـــن دردهـــا تـــا زنـــده‌ام
گـــر بخـــواهم شـــهد و شـــكر پـــيش مـــن آرنـــد صـــبر
تلـــخ و تنـــدى گـــر بنوشـــم مـــن چـــرا آســـوده‌ام
كـــي خـــلاص يـــابم ازيـــن غمهـــاى بـــي پايـــان خـــدا
جـــاهلم در ايـــن زمانـــه گـــر چـــه پســـيار خوانـــده‌ام
زيـــر پـــاران پشـــت شكســـته اســـپ تـــازى كـــي روا
طـــوق زر در كـــردن خـــر ژيـــن ســـبب آزرده‌ام
گـــاه در شـــرق گـــاه در غـــرب گـــاه در خـــاك جنـــوب
در فـــراوان زمـــين چـــون ســـبعه ســـياره‌ام
آب چشـــمم بكـــره جـــو يســـت گـــاه گـــاه خـــون ميچكـــر
آتشـــــت درد درونـــــم بابـــــاگرگر ســـــينه‌ام
اشـــتدي يـــا ازمـــه خـــوانم همـــا شـــام و ســـحر
اي خـــدا رحمـــي بفـــه‌رمـــه بنـــدى شـــرمنده‌ام
جملكـــي ســـوخته شـــد ان ســـيب انگـــور و انـــار
اي گـــل ســـرخ و ســـفير در حســـرتت افتـــاده‌ام
كـــورگرا بـــا گوســـفند چوبـــان نباشـــد كـــي رواســـت
زيـــن ســـبب همچـــون زنـــان بـــرك ســـياه پوشـــيده‌ام

---

[٥٢] ئه‌ڤ هه‌لبه‌سته ل ڕێككه‌ڤتى (١٩٨٨/٨/١٩)ێ، ل باژێڕێ (مويسل) هاتيه ڤه‌هاندن.

## (فرخنده سرشت)[٥٣]

بــــه جهـــان غمـــره شـــو فرخنـــــده سرشــــت
كــدرين ديــر فنــا چــون تــو بســى امــدد هشــت
خرمنـــت نيســـت چـــه گونـــا طلبـــى دانكـــوى
چـون درد ميكنـد آن كسـى كريـك غلـه تكشـت
تـــو چـــه دانـــى چـــه پســـد مـــدتى خـــود
كـــى بـــدوزخ ميـــروى يـــا ببرنـــد دى ببهـــهشـــت
بنـده بـي چـاره دريـن كـوت چـه تـدبيرى كنـد
كــى بشــديد آب دريــا آن كــى تقــديره تويشــت
گــنج اگــر مــن طلبــى رنــج بخــور يــار عزيــز
چـــه بامـــانج نرســـد ان فرتهـــى خـــورد و نوشـــت

---

[٥٣] ئەڤ هەلبەسته ل رێككەڤتى (١٩٩٠/٦/١٩)ێ، ل باژێرێ (مویسل) هاتیه ڤەهاندن.

## (گوش كن)[٥٤]

اگـــر گويمـــت بنـــد در گـــوش كـــن
غمـــى ايـــن جهـــان فرامـــوش كـــن
بتونـــدى و تلخـــى مبـــر قـــدرد خـــويش
شـــرابر حلـــم بـــره و نـــو شـــكن
طـــى ان نفـــس امـــاره چـــون آتشســـت
بـــاب يقـــين شـــعله خـــاموش كـــن
ژ وزەنگـــى گونـــا دلـــت پـــاك نمـــا
ميـــانى خـــودت بـــا خـــدا خوشـــكن

---

(٥٤) ئەڤ هەلبەستە ل ڕێككەڤتى (١٩٩٠/١٠/٢٠)ێ، ل باژێڕێ (مويسل) هاتيە ڤەهاندن.

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله وسلام على عباده الذين اصطفى

اعترف بأن الأخ ملا رسول عبدالله كان طالباً دينياً متجولاً يتلقى
العلوم الدينية من شيخ الى شيخ ومن عالم الى اعلم وقد قرأ لدينا
كتباً مختصرة ومطولة لذا اجزته بتدريس علوم التفسير والاحاديث
النبوية والفقه وجميع العلوم العقلية والنقلية وارشاد الناس
الى طريق الخير كما اجازني شيخي العلامة المرحوم الشيخ ابوبكر
ملا افندي عمر المدعو (ابكيكه ملا) كبير مشايخ اربيل كما صادق
على الاجازة خيرة علماء مدينة الموصل منهم المرحوم الشيخ
عبدالله النعمة والمرحوم الشيخ محمد الربوني تغمدهم الله برحمته واسكنهم
فسيح جناته وصادق عليها العلامة المفضال الاستاذ بشير
الصقال والله اسأل ان يوفق الجميع لخدمة هذا الدين الحنيف
آملين من حملة القرآن الحفاظ على التراث الاسلامي وان يكونوا
حراساً امناء وجنوداً اوفياء لحماية الدين من عبث العابثين
وكيد الكائدين بكل ما اوتوا من حول وقوة وارجو من المجاز الدعاء

كتب في الموصل ١٢٩٧ سنة الهجرية ٢٨ ربيع الاول

المجيز
علي يحيى علي

صورة منه الى الامانة العامة لادارة شؤون الاوقاف في اربيل
ملاحظة عين المجاز اماماً وخطيباً في ناحية جنارة بمحافظة اربيل

CamScanner الممسوحة ضوئيا بـ

صورة منه الى الامانة العامة لشؤون الاوقاف في اربيل

بسم الله الرحمن الرحيم

الى الامانة العامة لادارة شؤون الاوقاف في اربيل

م/ اجازة علمية

اعترف بان السيد ملا ياسين طه جمعة امام وخطيب قرية (الخالد) التابعة لناحية الكوير محافظة اربيل يقوم بأداء هذه الوظيفة بصورة صحيحة وحسنة كما انه اهل لذلك وعليه فمنحته الاجازة العلمية واجزته بقراءة القرآن الكريم والاحاديث النبوية وارشاد الناس الى الخير كما اجازني كبير مشايخ اربيل الشيخ ابوبكر ملا افندي عمر الموسوم (بكچك ملا) وصادق على الاجازة في مدينة الموصل الشيخ العلامة عبد الله النعمة والشيخ محمد الربوتي والشيخ المفضال الاستاذ بشير الصقال كبير مشايخ الحدباء حالياً افاض الله عليهم شآبيب الرحمة والرضوان والبسهم ملابس الغفران والله اسأل ان يوفق الجميع لخدمة هذا الدين الحنيف وارجو من المجاز الدعاء

كتب في الموصل سنة هجرية ٢٤ ربيع الاول ١٣٩٧

المصادف ليوم الاثنين ١٤ آذار سنة ١٩٧٧

المجيز

علي يحيى علي

شاركني الشمس صباحي في البكاء والجزع

قمر الافلاك بياد ياده مهی

على الضرغام الجسور الدر محمود الحفيد

ان تاريخ وفاته يا اخوانا خذ دمع

١٢٧٦

شيخ محمود چراغ جهان بود

شاهينى تيز چنگ م پاشيه پاك بود

چرغ جانشی ديده فردکی آشيانی بود

بسی اول وفاتی م غفران بود

گو مسلمان باخلاص روله و لاو ديتول كه

له فراق شيخ دلت محزون دملول كه

بو بهشته تشريف كی دروق و خيال بوم شيرين

ويره تاريخ وفاتی تا به تاريخ قبول كه

الفاتحه

في مرثية شيخ محمود الحفيد رثاه والدي يحيى علي شيوه

علي يحيى علي

بر لب دریای عمان تشنه لب در ماندئم
سالها خواهم که آزاد شوم هر بندئم

این چه تشویش و چه آشوب که بر ما بگذرد
چون فراموش میکنم زاین دردها تا زندئم

گر بخواهم شهد و شکر پیش من آرند صبر
تلخ و تندی گر بنوشم من چرا آسودئم

کی خلاص یابم از این عمرهای بی پایان خدا
جا هام در این زمانه گرچه بسیار خواندئم

زیر باران پشت شکسته اسپ تازی کی روا
طوق زر در گردن خر زین سبب آزردئم

گاه در شرق گاه در غرب گاه در خاک جنوب
در فراوان زمین چون سبعه سیاره ئم

آب چشمم بگره جو یست گاه گاه خون میچکد
آتش درد درونم با به گور گور سینه ئم

اشتدی یا ازمة خوانم هما شام و سحر
ای خدا رحمی بفرمو بندی شرمندئم

جنگلی سوخته شد آن سبب انگور و انار
ای گل سرخ و سفید در حسرت افتادئم

گورگ را با گوسفند چوپان بنا شد کی رواست
زین سبب همچون زنان برگ سیاه پوشیدئم

علی یحی علی
۱۹۸۸/۸/۱۹

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله وسلام على عباده الذين اصطفى

اعترف بأن الأخ ملا رسول عبدالله كان طالباً دينياً متجولاً يتلقى العلوم الدينية من شيخ الى شيخ ومن عالم الى اعلم وقد قرأ لدينا كتباً مختصرة ومطولة لذا اجزته بتدريس علوم التفسير والاحاديث النبوية والفقه وجميع العلوم العقلية والنقلية وارشاد الناس الى طريقة الخير كما اجازني شيخي العلامة المرحوم الشيخ ابوبكر ملا افندي عمر المرحوم (بكچكة ملا) كبير مشايخ اربيل كما صادق على الاجازة خيرة علماء مدينة الموصل منهم المرحوم الشيخ عبدالله النعمه والمرحوم الشيخ محمد الربّوني تغمدهم الله برحمته واسكنهم فسيح جناته وصادق عليها العلامة الفضال الاستاذ بشير الصقال والله أسأل ان يوفق الجميع لخدمة هذا الدين الحنيف آملين من حملة القرآن الحفاظ على التراث الاسلامي وان يكونوا حراساً امناء وجنوداً اوفياء لحماية الدين من عبث العابثين وكيد الكائدين بكل ما اوتوا من حول وقوة وارجو من المجاز الدعاء

كتب في الموصل سنة ١٢٩٧ الهجرية ٢٨ ربيع الاول

المجيز
علي يحيى علي

صورة منه الى الامانة العامة لادارة شؤون الاوقاف في اربيل

ملاحظة: عين المجاز اماماً وخطيباً في ناحية جنارة محافظة اربيل

صورة منه الى الامانة العامة
لشؤون الاوقاف في اربيل

بسم الله الرحمن الرحيم

الى الامانة العامة لادارة شؤون الاوقاف في اربيل

م/ اجازة علمية

اعترف بان السيد ملا ياسين طه محمد امام وخطيب قرية (الخالدية)
التابعة لناحية الكوير محافظة اربيل يقوم باداء هذه الوظيفة
بصورة صحيحة وحسنة كما انه اهل لذلك وعليه منحته الاجازة
العلمية واجزته بقراءة القرآن الكريم والاحاديث النبوية وارشاد الناس
الى الخير كما اجازني كبير مشايخ اربيل الشيخ ابو بكر ملا افندي عمر الموسوم
(بكچك ملا) وصادق على الاجازة في مدينة الموصل الشيخ العلامة
عبدالله النعمة والشيخ محمد الربوتي والشيخ المفضال الاستاذ بشير
الصقال كبير مشايخ الحدباء حالياً افاض الله عليهم شآبيب
الرحمة والرضوان والبسهم ملابس الغفران والله اسأل ان يوفق
الجميع لخدمة هذا الدين الحنيف وارجو من المجاز الدعاء

كتب في الموصل سنة هجرية ٢٤ ربيع الاول ١٣٩٧
المصادف ليوم الاثنين ١٤ آذار سنة ١٩٧٧

المجيز
علي يحيى علي

# ناڤەرۆك



## پشكا ئێكێ

## هەلبەستێن ب زمانێ كوردی

## پشكا دوویێ

## هەلبەستێن ب زمانێ عەرەبی



## پشكا سێیێ

## هەلبەستێن ب زمانێ فارسی

